دەوڵەتی
پێغەمبەر

# دەوڵەتی
# پێغەمبەر

صلی الله علیه وسلم

لە نوسینی وەزیری جەنگی پێشووی
دەوڵەتی ئیسلامی
شێخ ئەبو حەمزەی موهاجیر
(اللە لێی وەرگرتبێت)

مكتبة
الهمّة

ساڵی چاپکردنی بەزمانی کوردی

1438 کۆچی

بڵاوکراوەتەوە بزمانی عەڕەبی

لە ساڵی 1429 کۆچی

وەرگیراوە
لەکتێبخانەی هیمە




کتێبخانەی هیمە

بسم الله الرحمن الرحیم

الحمد لله مالك الملك، المتنزه عن الجور، والمتكبر عن الظلم، المتفرد بالبقاء، السامع لكل شكوى، و الكاشف لكل بلوى، والصلاة والسلام على من بُعث بالدلائل الواضحة والحجج القاطعة بشيراءونذيراءوداعياء إلى الله بإذنه وسراجاً منيرا.

لە پاشان ..
کەواتە پێویستە گشت موەحیدێک بزانێت کەگشت نەتەوەکانی کوفر سەرەڕای جیاوازی ئامانج وڕێباز وپێکدادانی بەرژەوەندییەکانیان هەموویان درک بەوە ئەکەن کەگەیشتنی جیهاد بەقۆناغی حوکمڕانی بەحوکمی الله لەسەر زەوی وگەڕانەوەی خیلافەتی ئیسلامی لەهەرشوێنێکی سەرزەویدا بارێکی گران وترسناکە چوونە ناو جەنگە وتاقگەی خوێنینە، هەرئەوەش ئەو دۆسیەیە کەکۆبوونەتەوە لەسەر ئەوەی کەنابێت ڕێی پێ بدرێ یان ئاگربەستی لەگەڵدا بکرێ بۆئەوەش هەموو هۆکارێکی بەردەستیان گرتەبەر وبە گوێپێنەدانی هەموو بنەما ڕەوشتی وئاکار جوانییەکان کەماوەیەکی دوورودرێژە درۆی لەسەر ئەکەن لەبەردەم بەندە لاوازکراوەکانی الله، لەبەرئەوەی ئێمە بەداخەوە نەوەیەکین پەروەردەکراوین لەژێر سێبەری حوکمی زەلیلی وسەرنواندن وهەموو واتاکانی شکۆمەندی وکەرامەت لێمان دوورخرایەوە وشکۆمەندی خۆمان ومێژووی بونیاتنانیمان لەیادکردووە ئەوە بووە ئەرکی سەرشانمان کەمێک بۆی بگەڕێینەوە بەتایبەت ئەو بابەتانەی کەپەیوەستن بەدەوڵەتی نەبەوی وباروودۆخی دروستبوونەکەی، ولەبەرئەوەی لای زۆربەمان چەسپاوە کەتێگەیشتنی دەوڵەتی ئیسلامی وەك دەوڵەتی طاغوتییە ئەوەی کەوێنەی کێشرا لەلایەن سایکس وبیکۆ وەك دەوڵەتی سەدام وئەسەد و نامورارەك.

وە هەندێکمان بەهەڵە تێدەگات لەوەی کەتێگەیشتنی ئەو دەوڵەتەی کەپێویستە هەستێنرێتەوە وڕابگەیەندرێ وادەزانێ دەوڵەتێکی گەورەیە وهەورەکان لەئاسمانەوە ووتاری بۆ ئەدەن وئاڵتوون وەکو ئاو زۆردەبێت تێیدا وسوپاکانی ئەنێرێت کەسەرەتاکەی لای دوژمنە وکۆتاییەکەی لەبەغدادە.

دەسا با ڕووبکەینە مەدینەی نەبەوی بۆئەوەی سەرنجێک بدەین هەرچەندە شتێکی ساکاریش بێت لەجووڵەی بونیاتنانی دەوڵەتی نەبەوی، وئایا مەدینەی مونەوەرە تەنها شوێنێکی حەوانەوەی ئارام بوو تاکو لاوازەکان لەموسڵمانان پەنای بۆ بەرن؟ یان بریتی بوو لەقۆناغێکی نوێ لەقوربانیدان بەنەفس وماڵ و وەرزێکی تربوو لەوەرزەکانی هەژاری وترس وبرسێتی وکەمی ماڵ وموڵک ونەفس وبەروبومەکان؟ وئەمانەوێ بزانین ئایا دەوڵەتی

نەبەوی لەسەرەتاکانی هەستانەوەی ڕەگداکوتاو ومەتین بوو کەڕەشەبا نایلەرزاندەوە وە ئایا فیتنە وئاشووب ڕووی تێ نەدەکرد یان دڵەکان تێیدا گەشتبوونە گەروو وخەڵکی جۆرەها گومانیان بەپەروەردگاریان برد تێیدا؟

**ئایا کشتوکاڵی گەلەکە درووست بوو وبازرگانیەکەیان چالاک بووەوە وژمارەی پیاوەکانیان زۆر بووەوە، یان کوشتن لەپێناو الله گەنج وپیریانی دووریەوە وبازرگانیانی پەک خست وکشتوکاڵەکانیانی تەخت کرد؟**

**ئایا ئەو خاکە ئاوەکەی سازگار وهەواکەی پاک بوو یان خاکێکی زۆر لەدرم وکەم لەئاو بوو؟**

**ئایا سووپاکانی نەبەوی بەپێی پێویست بوون لەژمارە وپێداویستی، یان هەروەک الله وەسفیان دەکات (وَلَقَدْ نَصَرَكُمُ اللَّهُ بِبَدْرٍ وَأَنْتُمْ أَذِلَّةٌ ) لەکەمی ژمارە وبێ نرخی پێداویستییەکان وتەنگەبەری ژیان؟**

لەکۆتایشدا بەڕاستی بانگخواز بۆئەم ئاگادارییە لەسەر تێگەیشتنی دەوڵەت ئەوەیە کەئێمە لەعێراقین وهەموو موەحیدێکمان لەگەڵدایە هەست بەدڵخۆشی وخۆشحاڵی ئەکەین وئێمەش لەدووای چەند ڕۆژێکی کەم یادەوەری دووەممان بەسەر تێپەڕ دەبێت بۆهەستانەوەی دەوڵەتی ئیسلامی لەسەر خاکی عێراق .. دوو ساڵ لەئارامگرتن وخۆڕاگرتن وقوربانیدان وفیداکاری .. دوو ساڵ وهێشتا بەردەوامە، سەری داگیرکەران ویارمەتی دەرەکانیان ئەدوورینەوە، کافرەکان تووڕە ئەکەین ودڵی ئیمانداران شیفا دەدەین.

دوو ساڵ بەخوێنی خۆمان کەشتییەکەیمان بەڕێکرد وبەئێسکە پەیکەری خۆمان بیناکەیمان بەرزکردەوە .. دوو ساڵە گەنجەکانی ئیسلام لەعێراق خۆڕاگرن لەسەر فەرمانی الله سەرەڕای مەینەتی وئاشووب وموو‌شەکەکانی باتڵ ئەوانەی کەهاوڕێی دوێنێ بوون وخەنجەریان لەپشتیدا، وەهەر لەکۆنەوە گووتوویانە: ئەو لێدانەی کەلەناو نابات ئەوا بەهێزتری دەکاتەوە.

دەسا الحمدلله کەئەمڕۆ ئێمە زیاتر خۆڕاگرین ودڵنیاترین بەسەرکەوتن لەلایەن الله وزیاتر خۆشحاڵین ودەستگرتووین بەدەوڵەتەکەمانەوە (وَلَمَّا رَأَى الْمُؤْمِنُونَ الأَحْزَابَ قَالُوا هَذَا مَا وَعَدَنَا اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَصَدَقَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَمَا زَادَهُمْ إِلاَّ إِيمَانًا وَتَسْلِيمًا).

**دەسا ئاکاری ئەو خاکەی کە پەیامبەر ﷺ هیجرەتی بۆکرد ودەوڵەتی ئیسلامی یەکەمی تێدا بونیاتنا چی بوو؟**

پێشەوا أحمد وهەردوو شێخەکە وابن اسحاق گێڕاویانەتیەوە لە عائشة وە ﵂ کەدەڵێت: « کاتێک پەیامبەر ﷺ گەیشتە مەدینە لەکاتێکدا نەخۆش هەڵگرترین خاک بوو لەسەر زەوی الله لەبەر گەرمایەکەی، ودۆڵێکی تێدابوو ئاوی لێڵی تێدا دەڕۆشت کەهاوەڵەکانی بەهۆیەوە تووشی بەڵا ونەخۆشی هاتن ودواتر الله ئەو بەڵا ونەخۆشیەی لابرد لەسەر پەیامبەرەکەی». لە «الموطأ» هاتووە لەعبدالله کوڕی عەمرِی کوڕی عاص ﵄ ەوە کەدەڵێت: « کاتێک گەیشتینە مەدینە تووشی نەخۆشی بووین لەبەر گەرمییە بەتینەکەی، پەیامبەر ﷺ دەرچوو بینی نوێژیان دەکرد بەدانیشتنەوە، پەیامبەر ﷺ فەرمووی : «نوێژی دانیشتوو هاوشێوەی نیوەی نوێژی هەستاوەیە».

لە عائیشەوە ﵂ هەروەک بە صەحیحی هاتووە، کە کاتێک بیلال نەخۆش بوو ئەیگووت: «پەروەردگارم نەفرەت بکە لە شەیبەی کوڕی ڕەبیعە، وعوتبەی کوڕی ڕەبیعە، وئومەییەی کوڕی خەڵەف، واچۆن ئێمەیان دەرکرد لەسەر ئەرزی خۆمان بەرەو ئەرزی گەرما»، پاشان پەیامبەر ﷺ فەرمووی: «پەروەردگارم خۆشەویستی مەدینەمان پێ ببەخشە هەروەک خۆشەویستیمان بۆ مەککە یان زیاتریش، پەروەردگارم بەرەکەت بخە ناو کاسەمانەوە وبۆمانی تەندروست بکە وگەرماکەی بگۆڕە بە ئاوی سازگار، دەڵێت: «وە گەیشتینە مەدینە لەکاتێکدا گەرمترین زەوی الله بوو»، دەڵێت: «لەوێدا دۆڵێک ئاوی گەرمی تێدەڕۆشت».

ابن بطال ﵀ دەڵێت: «کاتێک پەیامبەر ﷺ بینی کەگەرمی وناڕەحەتی تووشی هاوەڵەکانی بوە ترسا لەوەی نەفسەکان ڕق هەڵبگرن لەشارەکە لەبەر زۆر سەختی هەربۆیە داوای لە الله کرد ناڕەحەتیەکەیان لەسەر لابدات وخۆشەویستی مەدینەیان پێ ببخشێت هەروەک خۆشەویستییان بۆ مەککە یان زیاتریش». تەواوبوو

ئەوەتا گەرمای مەدینە تووشی هاوەڵانی پەیامبەر ﷺ بووەوە تەنانەت عائشة ﵂ دەربارەی باوکی وبیلال دەیگووت: «ووتم ئەی پەیامبەری الله ئەوان تێناگەن لەبەر سەختی گەرماکە»، وەهەروەها هەندێک لەکۆچکردووان پشتی هەڵکرد وئارامی نەگرت لەسەر ناڕەحەتیەکانی مەدینە، هەروەک لەهەردوو صەحیحەکەدا هاتووە ولەفزەکەش هی «مسلم»ە کە هەشت کەس لە «عوقەل» هاتنە لای پەیامبەر ﷺ وبەیعەتیان پێدا لەسەر ئیسلام بەڵام خاکەکە بۆیان ناڕەحەت بوو ولاشەیان تووشی نەخۆشی بوو ولە «بخاري»شدا هاتووە حەزیان نەکرد بەمەدینە ولەلای «أحمد» هاتووە کە هاتنە لای پەیامبەر ﷺ وپێیان گووت کەئەوان خەڵکی دەشتن وخەڵکی شار نیین وسکاڵایان کرد لەسەر گەرمای مەدینە.

وەهەر بە صەحیحی لە جابر کوڕی عبداللە وە هاتوە کە دەشتەکییەک بەیعەتی بەپەیامبەردا ﷺ لەسەر ئیسلام ودەشتەکییەکە تووشی نەخۆشی بوو لەمەدینە ودەشتەکییەکە هاتە لای پەیامبەر ﷺ ووتی: «ئەی پەیامبەری الله بەیعەتەکەم هەڵدەگرمەوە»، پەیامبەر ڕەتی کردەوە ﷺ.

لەوانەی پێشوو بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە ئەو خاکەی الله هەڵیبژارد بۆهیجرەتی پەیامبەرەکەی وجێبەجێکردنی دینەکەی خاکێکی زۆر نەخۆشی ئامێز بوو ئاوەکەی پیس بوو تەنانەت گەورە هاوەڵەکان وەکو بیلال ﷺ بەڵاکەی گەورە بووەوە ودوعای کرد لەو کافرانەی کە بوونە هۆکاری هاتنیان بەرەو مەدینە ئەویش هەروەک خۆیەتی لەئارامگرتن لەسەر بەڵاکان ولەگەڵ ئەوەشدا ئەم نەخۆشی وئەو بەڵایە هەرگیز ڕێگەی بەکەس نەدا خاکی هێجرەت جێبهێڵێت وپشت هەڵبکات هەروەک لەبەسەرهاتەکەی «عوقەلیەکان» ودەشتەکییەکەی پێشوو باسمانکرد.

وئارامگرتن وەکو نیشانەیەکی خۆشگوزەرانی مرۆڤ مایەوە لەسەر بەڵاکانی مەدینە تەنانەت لەدووای مەرگی پەیامبەر ﷺ لەصەحیحی موسلم لە ئەبو سەعیدی گەورەی (المهري) کە هاتووەتە لای ئەبو سەعیدی خودریەوە لەشەوێکی گەرمدا وڕاوێژی لەگەڵی کرد وسکاڵای بەرزی نرخەکان وزۆری منداڵەکانی لای کرد وەهەواڵی پێیدا کەئارامی نییە لەسەر سەختییەکانی مەدینە ومانەوە تێیدا، ئەویش پێی گووت: «وای بەحاڵت فەرمانت پێ ناکەم لەسەر ئەوە من بیستم پەیامبەر ﷺ ئەیفەرموو: «هەرکەسێ ئارام بگرێ لەسەر سەختییەکانی وبمرێت ئیلا بۆی دەبمە شەفاعەتکار یان گەواهیدەر لەڕۆژی قیامەت بەمەرجێک موسڵمان بێت».

جگە لەوەش ژیانی هاوەڵە بەڕێزەکان لەدەوڵەتە نەبەوییەکە ژیانێکی ترس وئامادەباشی وئاگاداری هەمیشەیی بوو بەتایبەت لەقۆناغە سەرەتاییەکانی دروستبوونی وڕۆژانی مەینەتی، لەصەحیحدا هاتووە لە ئەنەسەوە ﷺ کەدەڵێت: «پەیامبەر ﷺ چاکترین کەس وبەخشندەترین کەس وئازاترین کەس بوو، گووتی: خەڵکی مەدینە ترسان لەوکاتەدا کەدەنگێکیان بیست، گووتی: پەیامبەر ﷺ لەسەر ئەسپەکەی گەیشت بە ئەبو طەلحە کە ڕووت بوو وشمشێرەکەشی ڕاگیرکردبوو وفەرمووی: بۆچی دەترسن، بۆچی دەترسن»، پاشان پەیامبەر ﷺ فەرمووی: «ئەسپێکم دۆزییەوە».

ئەم دەنگەش بووە هۆی دەرچوونی خەڵکی وترسابوون وترسیان لێ نیشتبوو دەردەچوون لەبەر بچووکترین ترسناکی هەرچەندە تەنها ئەگەرێکیش بێت بۆنموونە دەنگی بەردێک

لەسەر لوتکەی چیایەکەوە بەربووبێتەوە کەئەویش لەئەمڕۆدا هاوشێوەی دەنگی بۆمب بارانەکانە کەدوژمن بەسەرماندا ئەیبارێنێت -اللە دووری بخاتەوە-.

بەهەمان شێوە ئوممەت ئەگەر لەحاڵەتی جەنگ بێت ونزیک بێتەوە لەدوژمن وهەست بکات بەهێرش وهەڵکوتانی دوژمن لەهەر ساتێکدا ئەوا پێویستە لەسەری مامەڵە بکات لەسەر ترسناکیەکە نەک گوێی پێ نەدات، المهلب ﵀ دەڵێت: «بەڵام پەیامبەر کاتێک ترسناکیەکەی داهاتووی بینی زانی هیچ نابێت هەروەک اللە دەفەرمووێت ( واللە یعصمك من الناس )». تەواوبوو

لێرەشدا سوودێکی گرنگی تایبەت بەئەمیر وپێشەواکان هەیە ابن بطال ﵀ دەڵێت: (تێکڕای ئەمەش ئەوەیە پێشەوا بۆی نییە نەفسی خۆی گرنگی بەخۆی نەدات لەبەرئەوەی لەوەدا ڕێکخستنێک بۆ موسڵمانان وکۆکردنەوەیە بۆ ووشەکانیان».

**وپەیامبەر ﷺ کاتێک سەرەتا هاتە مەدینە خۆیماندوو دەکرد لەپاسەوانی خۆی وەکو ئاگادارییەک لەدوژمنەکانی ودەستگرتن بەهۆکارەکانەوە هەتا ئەوکاتەی اللە تعالی فەرموودەکەی خۆی دابەزاند: (واللە یعصمك من الناس). واتە: اللە دەتپارێزێت لەخەڵکی.**

بەصەحیحی هاتووە لە عائیشەوە ﵂ کەپەیامبەر ﷺ شەونخونی دەکرد کاتێک هاتە مەدینە فەرمووی: «خۆزگە پیاوێکی چاکەکار لەهاوەڵانم ئەمشەو پاسەوانیم بکات»، ڕاستەوخۆ گوێبیستی دەنگی شمشێرێک بووین، فەرمووی: «ئەمە کێیە؟ «، ووتی: منم سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصم هاتووم پاسەوانیت بکەم»، پەیامبەر ﷺ نووست لە گێڕانەوەیەکی تردا هەتا گوێبیستی پڕخەی بووین.

وەلای نەسائي هاتووە کەپەیامبەر ﷺ کاتێک سەرەتا هات بۆ مەدینە شەوان نەدەخەوت، ئەوەتا پەیامبەری اللە ﷺ ماندوو دەبوو لەدرێژایی پاسەوانیەتی وچێژی لەخەوتن نەبینی تەنانەت ئاواتەخوازی کەسێک بوو پاسەوانیەتی بکات ئەوەش لەبەر هیچ نەبوو جگە لەزۆری ئاگاداربوون حەزەری ﷺ، وە پەیامبەر ﷺ چاکترین پاسەوان بوو سەرەڕای ماندوویەتی گوێبیستی دەنگی شمشێر بوو وهەستا بۆئەوەی هەواڵ پەیدابکات، حافظ لە «الفتح»دا دەڵێت: « لەم فەرموودەیەشدا بەڵگەیە لەسەر ئاگاداربوون وپاسەوانی کردن لەدوژمن، وخەڵکی لەسەریانە دەسەڵاتدارەکەیان بپارێزن لەترسی کوشتن، وەهەروەها تێیدا ستایش بەچاکە هەیە لەسەر خۆبەخشین وناونراوە بە چاکە، بەڵکو پەیامبەر ﷺ ئەو ئازارەی چەشت لەگەڵ هێزی پشت بەستنی بە اللەی ئەویش لەپێناو بە سوننەت کردنی، وە

دوو قەڵغانی بەستبوو لەگەڵ ئەوەی کەکاتێک جەنگ توونددەبوو لەپێش هەموو سووپاکە دەبوو، بەهەمان شێوە پشت بەستن بە الله پێچەوانەی گرتنی هۆکارەکان نییە لەبەرئەوەی پشتبەستن کاری دڵە وهۆکارەکان کاری جەستەیە». تەواوبوو

**لەفەرموودەکانی پێشوودا سوودی تێدایە لەگرنگترینیان دوو خاڵن:**

یەکەم: لەووتەکەیەوە ﵁: «پەیامبەر ﷺ پێیان گەیشت لەسەر ئەسپێکی ئەبو طەلحە وشمشێرێکی پێ بوو»، ئەم فەرموودەیە بەڕوونی ئاستی ئامادەباشی پەیامبەرمان بۆ دەردەخات بۆکوشتار ﷺ لەکەمترین ماوەدا، وبەڕاستی چەکەکەی ئەو ﷺ وکەرەستە جەنگیەکانی شاراوە نەبوون لەدوور بەڵکو چەکەکەی بەقەد خۆیەوە هەڵدەگرت یانیش لەنێو دەستی دەبوو، خێراترین کەس بوو بۆ وەڵامدانەوەی بانگەواز وئامادەترین کەس بوو.

بەپێی پیاوچاکانی ڕێبازی شافیعی هەڵگرتنی چەک واجبە وداگرتنی حەڕامکراوە چ جای شاردنەوەی چەک لەکاتی هەبوونی ترس لەدوژمن، الله تەعالا دەفەرمووێت: (وَدَّ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْ تَغْفُلُونَ عَنْ أَسْلِحَتِكُمْ وَأَمْتِعَتِكُمْ فَيَمِيلُونَ عَلَيْكُم مَّيْلَةً وَاحِدَةً ). ئیبن کەثیر ﵀ دەڵێت: «ئەما فەرمان بەهەڵگرتنی چەک لەنوێژی ترسدا ئەوا لای لایەنێکی زانایان واجبە لەبەر ڕووی ئاشکرای ئایەتەکە ئەمەش یەکێکە لەدوو ووتەکەی شافعی وئەوەی بەڵگەیە لەسەری ئەم ئایەتەیە: (وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن كَانَ بِكُمْ أَذًى مِّن مَّطَرٍ أَوْ كُنتُم مَّرْضَىٰ أَن تَضَعُوا أَسْلِحَتَكُمْ وَخُذُوا حِذْرَكُمْ )، قورطوبی ﵀ دەڵێت: «ئەوانەی لایەنە دیارەکەیان وەرگرت و ئایەتەکەیان وەك خۆی وەرگرت گووتیان: «هەڵگرتنی چەک لەنوێژی ترسدا واجبە لەبەر فەرمانی الله پێی ئیلا ئەوانەی بارانبارین ئازاریان بدات لێی جیاکراوەنتەوە ئەگەر ئەوە بێت ئەوا بۆی جائیزە چەکەکەی دابنات»، ئیبن عەرەبی دەڵێت: «ئەگەر نوێژ بکەن چەکیش لەگەڵ خۆیان هەڵدەگرن لەکاتی هەبوونی ترس»، شافعیش وای گوتووە وهەر ئەوەش لەدەقی قورئاندا هاتووە» کۆتایی

لەووتەکانی ئیبن عەرەبی یەوە بۆمان ڕووندەبێتەوە کە واجب بوونی هەڵگرتنی چەک پەیوەستە بەهەبوونی ترسان لەدوژمن بەگشتی جیاوازی نییە لەکاتی نوێژدا یان لەهەر کاتێکدا بەلایەنی چاکترەوە؛ لەبەرئەوەی هەڵگرتنی چەک لەکاتی نوێژدا گومانی تێدا نییە دەبێتە هۆی زۆری جۆرێک لەجووڵانەوەی زیادە ودەبێتە هۆی ناڕەحەتی بەڵام لەپێناو پاراستن لەدوژمن ئەوە واجب کراوە.

قورطوبی ﵀ دەڵێت: « ئەمەش بەڵگەیە لەسەر دووپاتکردنەوەی ئامادەباشی وئاگاداربوون لەبەرئەوەی هەرگیز سووپا تووشی کێشە نابێت ئیلا بەهۆی کەمتەرخەمی لەئاگاداربوون»،

ضەحاک دەڵێت: «لەفەرموودەی الله تەعالادا { وخذوا حذركم } واتە شمشێرەکانتان ڕاگیربکەن چونکە هەرئەوە شێوازی جەنگاوەرە». کۆتایی هات

کەواتە تەقوای الله بکەن ئەی موجاهیدان وچەکەکانیشتان مەشارنەوە چونکە ئێوە لەجیهادێکدان کەفەڕزی عەینە لەسەرتان، وئامادەباشی تێیدا لەهەموو چرکەساتێک واجبە، هەروەها موجاهید بەدیل ئەگیرێت بەهۆی دانانی چەکەکەیەوە بەبیانووی کاری ئەمنی، هەروەها دەبێت موجاهید شتی کێش سووک وسوودبەخش هەڵبگرێت بۆنموونە پشتێنێک لەنارنجۆکی دەستی وچەکێکی ڕەشاشی کێش سووک.

هەڵوێستەی دووەم: ئەمیش فەرموودەی پەیامبەرە ﷺ: «خۆزگە پیاوچاکێک لەهاوەڵەکانم ئەمشەو پاسەوانی بکردایەم »، لەم فەرموودەیەشدا ئاگادارکردنەوە هەیە لەسەر گرنگی وگەورەیی پاسەوانێتی، لە ئیبن عەباسەوە رضي الله عنه کەدەڵێت: پەیامبەر ﷺ فەرموویەتی: « دوو چاو هەرگیز نایانسوتێنیت: چاوێک گریابێت لەترس وخشوعی الله، وچاوێک لە پاسەوانێتی مابێتەوە لەپێناو الله».

لای حاکم لە ئیبن عومەرەوە رضي الله عنهما کەدەڵێت: پەیامبەر ﷺ فەرموویەتی: «ئایا شەوێکتان پێ ڕابگەیەنم کەچاکترە لەشەوی قەدر، پاسەوانێک پاسەوانێتی کردبێت لەسەر خاکێکی ترسناک ڕەنگ بێت نەگەڕێتەوە ناو خێزانەکەی».

لەعثمانی کوڕی عەفانەوە رضي الله عنه کەدەڵێت: من گوێبیستی پەیامبەر بووم ﷺ ئەیفەرموو: «پاسەوانێتی شەوێک لەپێناو الله تعالی چاکترە لەهەزار شەو تێیدا شەونوێژ بکرێت وبەڕۆژ بەڕۆژوو بێت»، پێشەوا ئەحمەد گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «هەرکەسێ لەپشتی موسڵمانانەوە پاسەوانی بکات لەپێناو الله تعالی خۆبەخشانە ودەسەڵاتدار نەیناردبێت ئەوا ئاگر بەچاوی خۆی نابینێت ئیلا مەگەر بردنەسەری سوێندەکە چونکە الله تعالی دەفەرموێت: ( وَإِنْ مِنْكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا )».

وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت: خۆشبەختی بۆبەندەیەک ڕەشمەی ئەسپەکەی گرتبێت لەپێناو الله قژ ئاڵۆز وپێ خۆڵاوی ئەگەر لەپاسەوانیدا دابێت ئەوا پاسەوانی دەکات ئەگەر کەسیش نەیناسێت ئەوا کەس نایناسێت ئەگەر ئیزن بخوازێت ئیزنی پێ نادرێت ئەگەر شەفاعەت بکات لێی وەرناگیرێت».

کەواتە پێویستە لەسەر موجاهید ئەگەر دووکەس یان زیاترین لەشوێنێکدا بخەون ئەوا

هاوڕێکان بەنۆرە پاسەوانی بکەن، ئەگەر یەکێکیان بخەوێت ئەوی تر پاسەوانی دەکات، ئەمەش سوننەتی پەیامبەرە ﷺ لەکاتی غەزا وجیهاد، لەبەرئەوە ئیسلام ڕێنمایی کردووین پەلەبکەین لەخەوتن لەدووای عیشا وبەفیڕۆنەدانی کات لەشتی بێ سوود، لەهەردوو صەحیحەکەدا هاتووە کە پەیامبەر ﷺ فەرموویەتی: حەزی نەدەکرد لەگفتوگۆ لەدووای عیشا.

گێڕدراوەتەوە دەربارەی عومەر ﵁ کە لەو کەسانەی دەدا کە لەدووای عیشا گفتوگۆیان دەکرد، ودەیگوت: «شەوچەرەی سەرەتای شەو وخەوتن لەکۆتاییەکەیدا؟» . گومانی تێدا نییە کە پاسەوانێتی لەپێناو الله هاوشێوەی سەنگەرنشینە، هەروەها سەنگەرنشینیش پاسەوانێتییە لەشوێنێکدا لەدوژمن بترسیت وبیترسێنیت.

پەیامبەر ﷺ دەفەرمووێت: «سەنگەرنشینی ڕۆژ وشەوێک لەپێناو الله چاکترە لەڕۆژوو وشەونوێژی مانگێک وئەگەر بمرێت پاداشتی هەمان پاداشتی بەڕۆژوو وشەونوێژەکە وەردەگرێت وڕزق وڕۆزی دەدرێت وپارێزراو دەبێت لەسەر فیتنەی قەبر». هەروەها ﷺ فەرموویەتی: سەنگەرنشینی ڕۆژێک لەپێناو الله چاکترە لەدونیا وئەوەشی کەتێیدایە».

کەواتە ئەی موەحید کەمتەرخەمی مەکە لەپاسەوانێتی خۆت وبراکانت، ئەوە زانیاریمان پەیداکرد لەسەر پاشماوەی کەمتەرخەمی لەپاسەوانێتی وئەو بەڵا وموسیبەتانەی کە بەدووایدا دێت، کەواتە تەقوای الله بکەن ئەی بەندەکانی الله وسوننەتی پەیامبەری الله وون مەکەن.

**هەرچی دەربارەی بارودۆخی ئابووری دەوڵەتی نەبەوییە:**

پێشتر دەوڵەتی نەبەوی بونیاتنراو لەسەر باری هەژاری بکوژ هیچ کەسێکی لێ پارێزراو نەبوو بچوک وگەورە، لەصەحیحدا هاتوە لە ئەیوب ئەویش لە محمدەوە دەڵێت: لەخزمەتی ئەبو هورەیرە بووین دوو جلی لەکەتان چنراوی لەبەر بوو، چڵمی هات گووتی: بەخ بەخ؛ ئەبو هورەیرە چڵمی بەکەتان دەسڕێت؟ منت بینی کە کەوتبووم لەنێوان مینبەری پەیامبەری الله ﷺ بەرەو ماڵی عائیشەلە هۆش خۆم چوبوم، کەسێک ئەهات وپێی ئەخستە سەر ملم وایدەزانی شێتم، من شێت نیم، بەڵکو بەهۆی برسیەتیەوە هۆشم نەمابوو».

ئەوانە میوانی ڕێزدارن لەمزگەوتی پەیامبەر ﷺ هەموو هاوەڵانیان دەبینی بەبێ هۆشی کەوتوون لەئازاری برسیەتی وناڕەحەتیەکانی هیچ کەسێك نەیدەتوانی هاوکاریان بکات، وئەگەر ئەبو هورەیرە ﵁ بڵێت هەروەک لەصەحیحدا هاتووە: «چاکەخوازترین کەس

بۆهەژاران جەعفەری کوڕی ئەبی طالیب بوو، بەلاماندا تێدەپەڕی مولکەکانی ماڵی خۆی ئەخستە ڕوومان، تەنانەت قاپێکی هەبووایە کە هیچی تێدا نەبووایە کەرتمان دەکرد وپێکەوە ژێر قاپەکەمان ئەلێسایەوە».

کەواتە ئەی موجاهیدی نوقم بوو لەنیعمەتەکانی الله بڕوانە حاڵی برسیەتی لەڕێزدارێکی وەکو جەعفەر میوانی ڕێزدار ڕووی تێکرد وهیچی نەبوو جگە لەقاپێکی لەچەرم دروستکراو کە پاشماوەی ڕۆنی تێدا مابوو کەرتیان کرد بۆئەوەی ژێرەکەی بلێسنەوە ! جگە لەمەش هاتنی جەعفەر بەرەو مەدینە لەفەتحی خەیبەر بوو، وئیسلام بوونی ئەبو هورەیرە لەهەمان ساڵدا بوو واتە لەساڵی حەوتەم لەهیجرەتی نەبەویەوە، واتە بارودۆخی هەژاری ئازاربەخشی تووند بەم جۆرە تووشی دەوڵەتی نەبەوی هاتبوو لەدووای حەوت ساڵ لەهەستانەوەی دەوڵەتەکە ولەدووای ئەوەی الله نیعمەتی خۆی بەسەر موسڵماناندا ڕژاندبوو بەهۆی غەنیمەتەکانی خەیبەر، سەرەڕای بارودۆخی میوانەکانی ئیسلام وبرسیەتییان هاوەڵە بەڕێزەکە هەواڵمان پێ دەدات کە چۆن لەگەڵ گەورەکانی گەلەکە دادەنیشت وپرسیاری ئایەتێک لەکتێبی (الله)ی لێ دەکردن کە دەڵێت: « تەنها بۆ ئەوە پرسیارم لێکرد تا تێرم بکات و بمباتەوە بۆ ماڵی خۆی «، هەتا پەیامبەر ﷺ بانگیکرد وشیری دۆزییەوە لەماڵی خۆیدا وپێی بەخشی وفەرمووی: «ئەی ابا هر»، گووتم: «ئامادەم ئەی پەیامبەری الله»، پێی فەرموو «بڕۆ بەشوێنی ئەهلی صوفە وبانگیان بکە بۆم»، ووتی: «ئەهلی صوفەش میوانی ئیسلامن، هانا نابەن بۆ خێزان وماڵ وهیچ کەسێ، [ئەهلی صوفە واتە کۆچکردووە گەنجە نامۆکانی ئیسلام کەهیچ ماڵ وخێزان وشتێکیان نەبوو هەندێکات زۆربوون هەندێ کاتیش کەم بوون پەیامبەر ﷺ زۆر خۆشی ئەویستن وهەمیشە خواردن ودیاری پێ ئەبەخشین وسەردانی ئەکردن]، ئەگەر بەخششی بۆ بهاتایە بۆیانی ئەنارد وهیچی لێ هەڵنەدەگرت بۆخۆی، وئەگەر دیاری بۆ بهاتایە بۆیانی ئەنارد وبۆخۆشی لێی ئەبرد وئەوانیشی ئەکردە هاوبەشی خۆی، ئەوەم پێ ناخۆش بوو گووتم: ئەم شیرە پەیوەندی چییە بە ئەهلی صوفەوە؟ مافی من بوو ئەم شیرە بخۆمەوە وبەهۆیەوە بەهێزبم، وئەگەر هات وفەرمانی پێکردم، من ئەبێ بۆیان بەرم، ئەبێ چیم بەربکەوێت لەم شیرە؟

ئەمەش سوارچاکی موسڵمانان هاوسەری کچی پەیامبەر ﷺ عەلی کوڕی ئەبو طالیبە لای جوولەکەیەک کاردەکات لەسەر چەند خورمایەک تاکو ئازاری برسێتی پێ بشکێنێت، لە ترمذی هاتووە کەدەڵێت: «لەڕۆژێکی سارد وکڕێوەدا لەماڵی پەیامبەر ﷺ دەرچووم وپارچەیەکی دڕاوم هێنا ناوڕاستەکەیم پێچاوە گەردنمەوە وناوەندم پێ بەستەوە وپشتێنم ڕاگیرکرد بەگەڵای خورما ومنیش زۆر برسیم بوو وئەگەر لەماڵی پەیامبەر ﷺ خواردن هەبووایە ئەوا لێم ئەمخوارد، بەڵام نەبوو، دەرچووم بۆئەوەی شتێک بەدەستبهێنم بەلای

جوولەکەیەک تێپەڕیووم کەئاوی دەردەهێنا بەخلۆکەیەک لەدرزی دیوارێکەوە تەماشایم دەکرد، ووتی: ئەوە چیتە ئەی دەشتەکی ئایا ئەتەوێ بەرامبەر دەرکردنی هەر سەتڵێ ئاو خورمایەکت بدەمێ؟ گووتم: بەڵێ کەواتە دەرگاکە بکەرەوە تا بێمە ژوورەوە، کردیەوە وچوومەژوورەوە وسەتڵەکەی پێدام وهەرچەند سەتڵم دادەگرت خورمایەکی پێ دەدام هەتا دەستم پڕبوو سەتڵەکەم داگرت گووتم ئەوەندەم بەسە هەموویم خوارد وپاشان بەرزمکردەوە پڕبوو لەئاو وخواردمەوە».

بگرە حاڵەتێکی برسیەتی جەرگبڕی بەئازار لە ئیبن عەباسەوە ﵄ کەپەیامبەر ﷺ پیاوێکی گەڕاندەوە وپێی فەرموو: « ئارەزووی چی ئەکەیت؟»، گووتی: «ئارەزووی نانی گەنمی نەهاڕاو ئەکەم»، پەیامبەر ﷺ فەرمووی: «هەرکەسێ نانی گەنمی نەهاڕاوی هەیە ئەوا با بیداتە براکەی».

بەڵام ئەگەر برسیەتی منداڵ ڕاوبکات ئەوا بە الله سەختە لەسونەنی ئەبی داوود هاتووە لە عەلی کوڕی ئەبو طالیبەوە ﵁ کەهاتە لای فاطیمە، وحەسەن وحوسەین ئەگریان گووتی: «چی ئەیانگریەنێت؟»، گووتی: «برسیەتی» .

لەترمذی هاتووە لە ڕافیعی کوڕی عەمرەوە کەدەڵێت: « بەردم دەهاوێشتە خورمای ئەنساریەک ئەوانیش منیان بردە لای پەیامبەر ﷺ ئەویش فەرمووی: «ئەی ڕافیع بۆچی خورماکەیان فڕێ دەدەی؟»، گووتی گووتم: «ئەی پەیامبەری الله بەهۆی برسیەتی».

وحاڵی پۆشاک وپارێزەری عەوراتیشیان چاکتر نەبوو لەحاڵی خواردنیان، لەصەحیحدا هاتووە کەسێک پرسیاری لەپەیامبەر کرد ﷺ دەربارەی نوێژکردن لەیەک جلوبەرگ پەیامبەر ﷺ پێی فەرموو: «ئایا دوو جلوبەرگتان نییە ؟ «.

ئەم جلوبەرگەش زۆرجار کورت وتەسک بووە کەخەریکبووە عەورەتی هاوەڵەکە دانەپۆشێت لەکاتی نوێژەکەیدا لەمزگەوتی پەیامبەر ﷺ ، لە سەهلی کوڕی سەعدەوە کەدەڵێت: «هەندێ پیاو لەگەڵ پەیامبەر ﷺ نوێژیان دەکرد پشتێنەکەیان ئەگەیاندە گەردنیان هاوشێوەی منداڵ، وبەئافرەتان ئەوترا سەرتان هەڵمەبڕن هەتا پیاوەکان ڕێک دەبنەوە لەدانیشتنی نێوان دوو سوژدەکە«.

ئیبن بەطال ﵀ دەڵێت: «طەحاوی دەڵێت: ئەوانەی کەپشتێنیان بەگەردنیانەوە گرێ دەدا لەبەرئەوەبوو هیچی تریان نەبوو الله زاناترە، چونکە ئەگەر هیتریان هەبووایە ئەوا

ئەیانکردە بەرخۆیان لەکاتی نوێژدا وپێویستی بەوە نەدەکرد ڕێگری لە ئافرەتان بکرێت کە سەریان بەرزنەکەنەوە لەوکاتەی پیاوەکان ڕێکبوونەوە لەدانیشتنی نێوان دوو سوجدەکە وحوکمەکانیان جیاوازی تێبکەوێ لەنوێژدا ئەوەش پێچەوانەی فەرموودەی پەیامبەرە ﷺ دەربارەی پێشنوێژی:

جیاوازی لەسەر نیە « هەروەها فەرموویەتی: «ئەگەر سەری بەرزکردەوە [لەسوجدە] ئێوەش سەرتان بەرزکەنەوە»، ئایا نابینیت کە عەمرِی کوڕی سەلەمە لەوکاتەی نوێژی بەگەلەکەی دەکرد وعەورەتی دەرئەکەوت بەهۆی ئەوەوە بوو جگە لەو پۆشاکە کورتەی نەبوو ولەوکاتەی کەپۆشاکێکی نوێیان بۆکڕی کەدایپۆشێت لەکاتی نوێژدا گووتی: «بەهیچ دڵخۆش نەبووم ئەوەندەی ئەوە»، سەرهەڵبڕینی ئافرەتان قەدەغەکرا بەهۆی ئەوەی عەورەتی پیاوەکانی پێش خۆیان هەست پێ نەکەن لەکاتی سەرهەڵبڕین لەسوجدەدا». کۆتایی

ئایە دوای ئەو هەژاریە هەژاری تر بوونی هەیە؟ ڕەنگە مرۆڤ ئارامبگرێت لەسەر ئازاری برسیەتی بەڵام ئەگەر هیچ نەدۆزێتەوە عەورەتی خۆی پێ داپۆشێت ئەمەیان بەڕاستی زۆر ئازاربەخش وسەختە، وپەیامبەر ﷺ وهاوەڵە بەڕێزەکانی ئەم بارودۆخە ببینن وهیچیشیان لەدەست نەیات تێدا گومانی تێدا نییە کەبارودۆخیان زۆر سەخت بووە، ئەوەش کەچاوی موەحید پڕ فرمێسک ئەکات ئەم بارودۆخی هەژارییە پەیامبەر ﷺ یشی گرتەوە ئەو کەچاکترین بەدیهێنراوەکانی الله وبەڕێزترینیان وشەریفترینیان بوو، لەصەحیحی موسلیمدا لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە رضي الله عنه دەڵێت: «ڕۆژێکیان هاتمە لای پەیامبەر ﷺ بینیم دانیشتووە لەگەڵ هاوەڵەکان قسەی بۆیان دەکرد سکی خۆی بەتوندی گرتبوو، ئوسامە گووتی: منیش ئاگاداربووم وبەهەندێ لەهاوەڵەکانم گووت: بۆچی پەیامبەر سکی بەتووندی گرتووە ﷺ؟ گووتیان: بەهۆی برسیەتییەوە»، لەگێڕانەوەیەکی تردا: ئەبو طەلحە پەیامبەری بینی ﷺ پاڵکەوتبوو لەمزگەوتەکەدا ولەسەر پشتەوە خۆی هەڵدەگەڕێنێتەوە بۆسەر سک هاتە لای ئوم سەلیم وگوتی: «من پەیامبەرم بینی ﷺ پاڵکەوتبوو لەمزگەوتەکەدا وخۆی هەڵدەگەڕاندەوە لەسەر پشتەوە بۆسەر سک وابزانم بەهۆی برسیەتیەوە بوو»، ئەنەس گووتی: «ئەبو طەلحە هاتە لای دایکم گووتی: «ئایا شتێک هەیە؟»، گووتی: «بەڵێ پارچە پارچەی نان وهەندێ خورمام هەیە ئەگەر پەیامبەر ﷺ بەتەنها بێتە لامان تێرئەخوات، بەڵام ئەگەر کەسێکی تریش لەگەڵ خۆیدا بهێنێت ئەوا ڕەنگە بەشیان نەکات» . فەرموودە.

کەواتە ئومێدت هەبێت ئەی ئەوکەسەی سکاڵای کەمی حاڵ وتەنگەبەری ژیان ئەکەیت بڕوانە پەیامبەرەکەت ﷺ سەختی برسیەتی بەسەرداهات هەتا بەڕووخساریدا هەستیان پێکرد بەڵکو لەسەر پشتەوە خۆی وەردەگێڕا بۆسەر سک لەبەر نارەحەتی برسیەتی ولەناو کۆمەڵێ لەهاوەڵان ئەنەس لێیان ئەپرسێت دەربارەی بارودۆخی وئەوانیش ئەڵێن بەهۆی

برسیەتییەوەیە، هیچ کەسێکیش شتێکی نییە بیداتێ ﷺ ، وە لەوکاتەی دۆزرایەوە تەنها پارچە پارچەی نان بوو کەناشێت بۆمیوانێکی ڕێزداری وەک پەیامبەر ﷺ ، هەروەها ﷺ چەندین شەوی بەسەر دەبرد بەبێ ئەوەی هیچ شتێک بخوات.

لە ئیبن عەباسەوە رضي الله عنه کە پەیامبەر ﷺ چەند شەوێکی یەک لەدوای یەک ئەمایەوە وخێزانەکەشی خۆراکیان نەئەدۆزییەوە وزۆربەی نانەکەشیان نانی جۆ ئەبوو، بەڵێ ئەی ئەو ئافرەتانەی بەڕووی هاوسەرەکانتان هەڵئەشاخێن وداوای خۆشگوزەرانی ئەکەن بەتایبەت موجاهیدەکانی پێناو الله، ئەوەتا خێزانەکانی پەیامبەر ﷺ وکچی بەڕێزترینەکانن کە برسیەتی تەنگی پێ هەڵچنیون، لەصەحیحی موسلیمدا هاتووە لە ئەبی هورەیرەوە رضي الله عنه دەڵێت: «سوێند بەوەی نەفسی ئەبی هوڕەیڕەی بەدەستەوەیە نەبوو لەخێزانەکانی پەیامبەر ﷺ بۆماوەی سێ ڕۆژی بەدوایەک لەنانی گەنم بخۆن هەتا دونیای جێهێشت». بەڵکو ئەو ﷺ خێزانەکانی لەنانی جۆ تێرنەبون یان لە کەپەکی نانەکەش هەروەک لەصەحیحەکەدا هاتووە لە ئەبی هوڕەیڕەوە رضي الله عنه دەڵێت: « خرج رسول الله ﷺمن الدنيا ولم يشبع من خبز الشعير». «پەیامبەر ﷺ لەدونیا دەرچوو وتێری نەخوارد لەنانی جۆ».

ئەوەی کە دڵ خوێناوی ئەکات ونەفس توانای بیرلێکردنەوەی نییە ئەوەیە کەبزانیت پەیامبەرەکەت ﷺ برسیەتی تەنگی پێ هەڵچنیوە هەتا ناچاربوو وەڵامی بانگکردنی جوولەکەیەک بداتەوە لەسەر خۆراکێکی ناخۆش بەڵکو قەڵغانەکەی وەک بارمەتە لای دانا تاکو هەندێ جۆی بداتێ وخۆراکی لێ دروستبکات بۆ خێزانەکانی لەصەحیحدا لەئەنەسەوە رضي الله عنه هاتوە دەڵێت: «چوومەلای پەیامبەر ﷺ بەنانی جۆو وڕۆنی ئاژەڵ بینیم کە قەڵغانەکەی وەک بارمەتە لای جوولەکەیەک دانابوو بەرامبەر بەبیست قاپ (صاع) لەخۆراک بۆخێزانەکانی، ڕۆژێکیان بیستم ئەیگووت: «لەئێوارەدا قاپێ خورما یان قاپێ دانەوێڵە لەماڵی ئالی موحەمەددا نەبوو -صل الله عليه وسلم-»، لەوڕۆژەدا نۆ خێزانی هەبوو».

حافظ لە «الفتح»دا دەربارەی فەرموودەی ﷺ: «لەئێوارەدا قاپێ خورما یان قاپێ دانەوێڵە لەماڵی ئالی موحەمەددا نەبوو ﷺ »، «ئەوەی گووت نەک لەبەر تووڕەیی ونەک لەبەر سکاڵا -پەنا بە الله- بەڵکو ئەوەی گووت وەکو داوای لێبوردنێک لەوەی وەڵامی بانگەوازی جوولەکەکەی دایەوە وقەڵغانەکەی لای بارمەتە کرد». کۆتایی.

بەڵێ پەیامبەر ﷺ وەڵامی بانگەوازی جوولەکەکەی دایەوە لەبەر برسیەتی لەسەر نانی جۆ وڕۆنی بەز تەنانەت بۆنیشی گۆڕابوو، بەڵکو پێویستی کرد گرنگترین شت لای موسڵمان لەچەکەکانی دەستی بکاتە بارمەتە، لەلای جوولەکەش، کە لەچاکترین بارودۆخەکانیدا

پارەکانی حەڵاڵ وحەڕامی تێکەڵ کراوە الله دەفەرمووێت:(گوێگرن بۆ درۆ و پارەی ڕبا و حەرام دەخۆن)، وە ئەگەر پەیامبەر ﷺ لای هەر موسڵمانێک بزانێ قەرز وەردەگرێ ئەوا بەدڵنیاییەوە ئەنجامی دەدا، حافظ دەڵێت: «زانایان دەڵێن: دانایی لەوەی ﷺ لەبری مامەڵە لەگەڵ هاوەڵەکانی مامەڵەی لەگەڵ جوولەکەیەک کردووە یان لەبەر ڕوونکردنەوەی جائیز بوونیەتی،یان لەبەرئەوەی هیچی تریان نەبوو بەجۆرێک ئەو خۆراکە باشترە لەداواکردن لەغەیری ئەو، یان لەبەرئەوەی ترسی ئەوەی هەبووە هیچی لەبەرامبەر وەرنەگرن ونەیویست تووشی نارەحەتییان بکات» . کۆتایی.

دەڵێم: مەحاڵە پەیامبەر ﷺ چەکەکەی بارمەتە بکات لای دوژمنەکەی هەرچەندە پەیمان بەستووش بێت ئیلا مەگەر بۆ زۆر پێویستی وبەبێ ئەم شێوەیە چارەسەر نەکرێ الله زاناترە.
.

ئەوەت بەس بێت بزانی کە هەروەک لەصەحیحدا هاتووە ﷺ کۆچی دوایی کرد وقەڵغانەکەی بارمەتە بوو لای جوولەکەیەک بەرامبەر بە سی قاپ لەجۆ کە وەکو خۆراکێک بردیەوە بۆ خێزانەکانی، لەڕیوایەتێکی تردا: بردیەوە وکردییە ڕزقێک بۆ خێزان ومنداڵەکانی، لە سونەنی پێشەوا ئەحمەددا: «هیچی شک نەبرد پێی تا برسیەتی بشکێنێت هەتا کۆچی دوایی کرد».

ئەمە بارودۆخی دەوڵەتی نەبەوی بوو لەسەرەتاکانی دروستبوونیدا هەتا کۆچی دواییشی ﷺ، برسیەتییەک گشتیانی گرتبووەوە تائاستێک ئەوەی برسییەتی بەسەردا نەهاتبێت ناتوانێت درک بەترسناکی ئەوە بکات، لەگەڵ ئەوەشدا هەرگیز گوێبیستی موسڵمانێک یان تەنانەت دووڕوویەکیش نەبووین تانە لەدەوڵەتەکەی بدات ﷺ دەربارەی ئەوەی کە خۆی ﷺ هیچی نەدەدۆزیەوە بۆخۆی بیخوات وبیداتە هاوەڵەکانی ئیتر چۆن خۆی گەمارۆ بدات ودەوڵەتێک ڕابگەیەنێت کەخاوەنی پێداویستییەکانی دەوڵەت نەبێت بگرە تەنانەت سادەترین پێداویستییەکانی دەوڵەت، خواردن وخواردنەوە.

**هەرچی دەربارەی بواری ئامادەکاری سەربازیشە بابزانین بارودۆخی سووپای نەبەوی چۆن بووە؟**
**ئایا هەمان نارەحەتییان هەبووە یان هەوڵی سەربازی زیاتربووە بەسەرباقی ژیانی مەدەنی ئاسایی؟**

لەهەردوو صەحیحەکەدا لە جابری کوڕی عبدالله رضي الله عنهما هاتوە دەڵێت: «پەیامبەر ﷺ کۆمەڵێکی نارد بەرەو «ساحل» وئەبو عوبەیدەیکوڕی جەڕڕاحی کردە فەرماندەیان ئەوان سێ سەد کەس بوون منیشیان تێدابووم، دەرچووین هەتا گەیشتینە نیوەی ڕێگا وخواردنمان لێبڕا، ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕڕاح فەرمانی بەدابینکردنی خۆراک کرد بۆسووپاکە هەموو

ئەو خواردنەی کە هەیانبوو کۆیانکردەوە خواردنی من خورما بوو هەمووڕۆژێ کەم کەم پێی دەداین هەتا تەواوبوو وایلێهات یەک خورمامان بەرئەکەوت، گووتم: خورمایەک بەشی چی ئەکات؟ گووتی بینیمان وونبوو کاتێک تەواوبوو»، لەڕیوایەتێکی تردا: «دەرچووین لەوکاتەدا ئێمە سێ سەد کەس بووین خواردنمان لەسەر شانمان هەڵگرتبوو لای موسلیم جزدانێک خورمامان پێبوو هیچی ترمان نەدۆزییەوە، ئەبو عوبەیدە یەک یەک خورمای پێ دەداین، گووتی: گووتم: چیتان لێ دەکرد ؟ گووتی: خورماکەمان ئەمژی وەکو منداڵ پاشان ئاومان ئەخواردەوە بەسەریدا بەم جۆرە بەشی ڕۆژێکمانی ئەکرد تاشەو، بەدارەکانمان لەگەڵای درەختمان دەدا بۆئەوەی بوەرێت پاشان گەڵاکانمان تێکەڵ بەئاو دەکرد وئەمانخوارد، لە بوخاریشدا: برسیەتیەکی تووند بەسەرماندا هات هەتا گەڵامان خوارد، لەوێدا ئەو سووپایە ناونرا بە سووپای گەڵاوەرین(جیش الخبط)»، لەم فەرموودەیەشدا سوودی گەورە بەدەستدێت، بەڵام ئەوەی کە لێرەدا باسی ئەکەین سێ هەڵوەستەیە:

**یەکەم:**

ﷺ دەڵێت: «جزدانێکمان پڕکرد لەخورما هیچی ترمان دەست نەکەوت» ودەڵێت «خواردنەکەمان لەسەرپشتمان هەڵگرتبوو هەتا تەواومانکرد».

ئەمە پەیامبەری اللەیە ﷺ بەسۆزترین کەسە بۆ بەدیهێنراوەکان ودەست گرتووترینیانە بەهەرشتێ سوودی بۆیان هەبێت یان ئازار دوربخاتەوە لەسەریان وزاناترین کەسە بەجەنگەکان سووپایەک ئەنێرێت بەرەو گەرمای بیابان وناڕەحەتیەکانی خۆراکیشیان لەسەر شانیان هەڵگرتبوو خۆراکەکەیان بەشی ڕێگاکەیان ناکات هەتا ئەگەنە دوژمن، کوشتاری دوژمنێکی ئامادەبوو ئەکەن،گومانی تێدا نییە کە ئەو ﷺ زانیاری هەبوو لەسەر ماوەی دووری جەنگەکە وکۆسپەکانی ڕێگا وسەربازێک چەند خۆراکی پێویستە جیاوازی نییە ئەگەر خۆی بیزانیبا یان پرسیاری لەهاوەڵە شارەزاکانی بکردبا بەتایبەت ئەمیری غەزوەکە، ئەوەمان بۆدەرکەوت لەگووتەی هاوەڵەکە ﷺ کە دەڵێت: جزدانێکمان پڕکرد هیچی ترمان دەست نەکەوت».

**لێرەدا پرسیارەکە ئەوەیە : ئایا جائیزە سووپایەک بنێریت بارودۆخی بەم جۆرە بێت؟ وە ئایا تانە لەبارودۆخێکی هاوشێوەی ئەمە لەدەوڵەتی ئیسلامی وهێزە سەربازییەکەی ئەدرێت؟**

دەڵێین : بەڕاستی پەیامبەر ﷺ هەموو توانای خۆی خستە گەڕ بۆ گەیشتن بە هۆکارەکە، وئیجتیهادی کرد لەداواکردنی ئەو شتەی ئەیانگەیەنێت بەئامانجەکە، پاشان پشتی بەست بەو زاتەی خەزێنەی ئاسمانەکان وزەوی بەدەستە هەرکەسێکیش پشت بە اللە ببەستێ ئەوا هەر ئەوەی بەسە.

هەربۆیە بیانووی لاوازی هۆکارەکان عوزر ورێگر نیین لەداواکردنی دوژمن، پەیامبەر ﷺ دەفەرموویت: «ئەگەر ئێوە پشت ببەستن بە الله بەمافی خۆی ئەوا ڕزقتان دەدات هەروەک ڕزقی باڵندەیەک دەدات سبەینان بەبرسیەتی دەردەچێت ئێواران بە تێروپڕی ئەگەڕێتەوە».

لەو فەرموودەیەشدا پەیامبەر ﷺ دەستگرتوو بوو بەجیهاد لەپێناو الله وداواکردنی دوژمن بەتایبەت لەساتەوەختی لاوازیدا، ئەو کارەشی ﷺ بەفیرۆدانی سەربازانی نییە -دووربێ لەو- هەروەها خۆلەناوبردن نییە هەروەک هەندێک کەس ئەمڕۆ دەیڵێن کە گوایە هەرکاتێک بۆ کردەوەیەک دەرچیت تێیدا هۆکارەکان کامڵ نەبووبن بەڕێک وپێکی ئەڵێن گوایە ئەوە خۆلەناوبردنە.

ولەکردەوەکەی ئەودا ﷺ سوودێکی پەروەردەیی نەبەوی گەورە وپایەداری تێدایە ئەوانە شوێنەوار وگرنگیەکەی دەزانرێت کە چۆن جیهادیان کردوە وەك عیبادەت: بەڕاستی بارودۆخەکان بەڕێناکەون ئیلا بە هەوڵدانێکی زۆر بۆ دەستخستنی هۆکارەکان، چونکە تەرکی گرتنەبەری هۆکارەکان یان کەمتەرخەمی تێیدا لەلایەن موجاهیدەوە ئەوا پاداشت وبەشی تەنها سەرشۆڕی ولەدەستدانی داواکاریەکانی دەبێت، هەرکەسێکیش ئیجتیهاد بکات لەداواکردنی هۆکارەکە وهەموو هەوڵێکی توانراو بخاتەگەڕ پاشان پشت بە الله ببەستێت ئەوا پاداشت وبەشەکەی خۆشبەختی دەبێت لەدونیا وئاخیرەتدا (وَعَلَى اللَّهِ فَتَوَكَّلُوا إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ)، الله بە مەریەم دەفەرموویت: (وَهُزِّي إِلَيْكِ بِجِذْعِ النَّخْلَةِ ) ئەگەر فەرمانەکەی پشتگوێ بخستایە وبیووتایە: سوودی چییە ئافرەتێکی لاواز بەرامبەر ڕەگی دارخورمایەک؟ ئەوا بێگومان بەرهەمەکە نەدەکەوتە سەرزەوی.

بەهەمان شێوە ئەگەر هاوەڵەکان یان یەکێکیان ڕێگریان بکردبا لەخواردنی خورمایەک وبیان گووتایە: ئەبێ سوودی چیمان پێ بگەیەنێت؟ ئەوا هەرگیز نەدەژیا وبێگومان لەو ڕێیەدا ئەمرد، موهەلیب رحمه الله دەڵێت: «ئەم خورمایە تێری ئەکردن بەهۆی بەرەکەتی پەیامبەر وبەرەکەتی جیهادیش لەگەڵیدا،بەڵکو الله بەرەکەتی خستە ئەو خورمایەوە هەتا بووە هۆکارێک بۆ ڕاگیرکردنی برسیەتی لەبەرئەوەی سرووشت لەشوێنی خۆیدا ناشکێت وبارودۆخەکان لەئاسۆی خۆیان دەرنەچن لەحیکمەتێکدا سەرەڕای ئەوەی الله بەتوانایە کە خواردنیان بۆ بەدیبهێنێت لەهیچەوە یان بەردێکیان بۆ بکاتە نان».

لەفەرموودەکەشدا ئەوەی کە هاوەڵەکان لەسەری بوون لەگوێگرتن وگوێڕایەڵی کردن لەخۆشی وناخۆشیدا وچاکی گومان و دورکەوتنەوە لە خووگرتن بەداروبەردی دونیاوە، هەستان خواردنەکەیان خستە سەر شانیان. هەروەک تاڕادەیەکی زۆر الله نیعمەتی

ڕژاندووەتە سەریان بەوەی کە لەسەری بوون لە ئارامگرتنێکی جوان وزبری ژیان کەنەفسی خۆیان ڕاهێنا لەسەری بەوەش توانای تێپەڕکردنی ئەو مەینەتییەیان پەیداکرد هەروەها ئارامیانگرت لەسەر موسیبەت وفیتنەکان.

هەروەها سوربوونی ماوەڵەکان ﷺ دەگرێتەوە لە سوربوون لەسەر جیهاد لەپێناو الله وداواکردنی ماڵی کافرەکان لەهەرشوێنێ بیانبینن هەرچەندە هۆکارەکانیشیان بەپێی پێویست نەبووبێت وتەنگەژەییەکان لەدەوریاندا کۆبووبێتنەوە وترس وبرسیەتی بەسەریاندا چەسپابێت، ڕەنگە کەسێک بڵێت پەیامبەر ﷺ نەیدەزانی کە بارودۆخەکە ئەگاتە ئەم ئاستە ! ئەڵێم: ئەهلی زانست خیلافیان هەبوو دەربارەی ئەم غەزوەیە خۆی هەندێکیان باسیانکردووە کە پەیامبەریش ﷺ لەگەڵیاندا بووە، بەڵام ڕاستتر وایە ناردبێتیانی هەروەک غەزوەی گەڵاوەرینەکە(غزوة خبط) لەغەزوەی (ذات الرقاع) بارێکی سەختتر ڕوویدا بەسەر پەیامبەر ﷺ لە ئەبو موساوە ﷺ دەڵێت: « دەرچووین لەگەڵ پەیامبەر ﷺ لەگەڵ جەنگاوەرانێک ژمارەمان شەش کەس بوو لەنێوانماندا ووشترێک هەبوو بەنۆرە سواری پشتی ئەبووین، پێیەکانمان پەنەمابوو پێیەکانی منیش پەنەمابوون ونینۆکەکانم کەوتبوون، بەپارچە قوماشێک پێیەکانمان پێچایەوە هەربۆیە ناونرا بە جەنگی پارچە قوماش (غزوة ذات الرقاع) لەبەرئەوەی شەقەکانی پێیەکانمان ناڕەحەتمانی دەکرد «.

شتە زۆر گرنگەکە لەم سوودە: ئەوەیە کە هەرچی بەسەر پەیامبەر ﷺ وماوەڵەکانیدا هات لەماندوویەتی وبرسیەتی ولێبوونەوەی ئەندامەکانی لەش ئەوا لەپێناو جیهادی داواکردن (طلب) بوو ئەوان دەرچوون داوای ماڵی کافرەکان بکەن، چ جای دەربارەی جیهادی بەرگری (دفع) ئەی بەندەکانی الله ؟ بەرگری لەئایین ونەفسەکان ئابڕوەکان،ئەهلی عیلم باسیان کردووە لەوەی کەهیچ مەرجێکی بۆ دانانرێت هەروەها بیانووی بێ بنەما وحوجەی درۆ سوودی نییە تێیدا وە الله خۆی هیدایەتی گشتمان بدات بەرەو هەرشتێ خۆشی بوێت ولێی ڕازی بێت.

**هەڵوەستەی دووەم:**

ئەویش گووتەی ماوەڵەکەیە ﷺ «ئەبو عوبەیدە فەرمانی کرد بەئامادەکردنی خواردن بۆسووپا هەموویان بۆئەوە خورمایان کۆکردەوە»، واتە ئەمیری سووپاکە ئەبو عوبەیدە ﷺ بەخشینی خەڵکە تایبەتەکانی کۆکردەوە وە هەموویانی وەک یەک بەشدارکرد لەدابەشکردن سەرەڕای ئەوەی ڕەنگە هەندێکیان زیاتریان کۆکردبێتەوە بەڵام زۆر پێویستیانە، وهەرکەسێ دەست بەماڵی خۆیەوە بگرێت ڕەنگە ببێتە هۆی ڕزگاربوونی.

ئیبن بەطال لە موهەلیب نەقڵی دەکات ﷬ کە دەڵێت: «دەسەڵاتدار بۆی هەیە فەرمانی یەکسانی بەخەڵکی بکات وناچاریان بکات بۆئەوە وبەشداریان بکات لەبەشکردن لەپێناو مانەوەیان لەژیانندا، وتێیدایە کەپێشەوا بۆی هەیە یەکسانی بکات لەنێو خەڵکیدا لە خواردندا لەکاتی ئامادەبووندا چ ماڵی هەبێت یان نا هەروەک لەم گەشتە ڕوویدا» . کۆتایی.

بەڵکو ئەبو عوبەیدە ئەم کارەی کرد پەیامبەری کردە پێشەوای خۆی ﷺ، لە سەلەمەوە ﷛ دەڵێت: «خۆراکی گەلەکە کەم بووەوە وبرسییەتی ڕووی تێیانکرد وهاتنە لای پەیامبەر ﷺ دەربارەی ئەوەی ووشترەکەیان سەرببڕن ئەویش ئیزنی پێیاندا»، لەفەرموودەیەکی تردا پەیامبەر ﷺ دەفەرمووێت: «بانگەواز بکەن لەنێو خەڵکیدا بێنە ئێرە بەچاکترین خۆراکەکەیانەوە»، لەسەر پێستێک فەرشیانکرد پەیامبەر ﷺ دوعای بەرەکەتی تێکرد، وە لەسوەیدی کوڕی نوعمانەوە کە پەیامبەر ﷺ دەرچوو لەساڵی خەیبەر هەتا گەیشتنە صەهباء کەدوورترین خاکە لە خەیبەر نوێژی عەسری پێ کردن پاشان بانگەوازی کرد بۆ هێنانی خۆراک هیچیان نەهێنا جگە لەخۆراکی «سوەیق» (خواردنێکە لە ئاردی گەنم و جۆ دروستدەکرێت). فەرموودە.

لەفەرموودەکانی پێشوودا هەمان شتی تێدایە کە دووپاتمان کردەوە دەربارەی بارودۆخی سووپای نەبەوی ولاوازی هاوکاری کردنیان، وتێیدایە حەزیانکردووە پێشەوا ناخی خەڵکی ئارام بکاتەوە هەرچەندە بەیەک ووشەی چاکیش بێت هەتا موڵکەکانی خۆیان ئامادەبکەن بە ئارامی ناخی خۆیانەوە لەبارودۆخە سەختەکاندا یان لەکاتی خۆشیدا بۆیان بگەڕێنێتەوە ئەگەرنا بۆی هەیە ناچاریان بکات لەسەر ئەوە ئەگەر لەبەر زەڕوڕەت بێت هەروەک لەووتەکانی موهەلیب هاتووە ﷬ بەتایبەت ئەوەی فەرموودەی جابر وهەردوو فەرموودەکەی پێشوو هیچیان تێدانییە جگە لەفەرمان بەکردار وهیچ باسی ئەوەی تیا نیە کە باسی نرخیان کردبێت.

جگە لەمەش پەیامبەر ﷺ ستایشی ئەم کردەوەیەی کردووە لەئامادەیی ولەگەشتدا پەیامبەر ﷺ لەهەردوو صەحیحەکەدا دەفەرمووێت: «بەڕاستی ئەشعەرییەکان ئەگەر بێخۆراک بمێننەوە لەکاتی غەزا یان خۆراکی خێزانیان کەم ببێتەوە لەمەدینە ئەوا هەرچییان هەیە کۆی دەکەنەوە لەناو یەک پۆشاکدا پاشان لەیەک قاپدا دابەشیان دەکرد لەنێو خۆیاندا بەیەکسانی، ئەوان لەمنن ومنیش لەوانم».

لەوەی پێشووەوە ستەمی هەرکەسێکینەفس نزممان بۆ ڕووندەبێتەوە کە سرووشتی پیسبووە وبەئەنقەست ماڵی (الله)ی بردووە وخۆراکی باشی تایبەت بەخۆی هەیە لەکاتی تەنگەژەییدا کە براکانی وخانەوادەکەی وبەتایبەت دیلەکان وشەهیدەکان، ئەو نەماڵی

خۆی بەخشیوە تاکو دابەشی بکات لەنێو خۆی وبرا پێویستەکانی نە هیچ خۆراکێکی بۆیان بەجێهێشتووە تاکو لێویانی پێ تەڕبکەن لەپێناو ئەوەدا گشت فێڵێکی کردووە، هەموو ئەوە لەژێر باری کاریگەری لاوازی یەقینە وئەو ئەیەوێت ڕزقێک بۆ منداڵەکانی بەجێبهێڵێت، نەفسە نزمەکان شکستیان هێنا ! لەئیبن عومەرەوە ﷺ دەڵێت : «دەرچووم لەگەڵ پەیامبەر ﷺ هەتا چووەناو هەندێ کۆڵانی ئەنسارییەکان خورمای لێ دەکردەوە وئەیخوارد پێمی فەرموو: «ئەی ئیبن عومەر بۆچی ناخۆیت؟» گووتم: «ئەی پەیامبەری الله حەزم لێی نییە»، فەرمووی : «بەڵام من حەزم لێیەتی ئەمەش چوارەم سبەینانە خواردنم نەخواردووە چونکە هیچم شک نەبرد ئەگەر بمویستبا داوام لە پەروەردگارم بکردبا ئەوا هاوشێوەی پاشای کیسرا وقەیسەری پێ دەدام، چۆن دەبیت ئەی ئیبن عومەر ئەگەر بمێنیتەوە لەگەلێکدا ڕزقی ساڵێکیان بشارنەوە ویەقینیان لاواز بێت» . - [ ]

**هەڵوەستەی سێیەم :**

دەربارەی هۆکاری غەزوەکە -هەرچەندە بەئەنقەست ئەم باسەمان دواخست- ئەویش لەووتەی هاوەڵەکە ﷺ «ووشترێک لەقورەیشیەکان بەدەستدێنین» واتە ئەو ووشترانەی کە خۆراک وشتومەکیان پێ باردەکرێت، پەیامبەر ﷺ دەفەرمووێت: پێنج شتم دراوەتێ هەرگیز بەکەس نەدراون لە پێش من: دوژمن لە دوری یەك مانگ لێم دەترسێت، وئەم خاکەم بۆکراوە بەمزگەوت وشوێنی پاکبوونەوە کەواتە هەرپیاوێک لەئوممەتەکەم پێی گەیشت لەکاتی نوێژدا ئەوا بانوێژەکەی تێدا بکات، وغەنیمەت بۆمن حەڵاڵ کراوە بەڵام بۆهیچ کەسێ لە پێش من حەڵاڵ نەکراوە»، سەعدی ﷺ دەڵێت: «ئەمەش لەبەر ڕێزی خۆیەتی لای پەروەردگاری هەروەها لەبەر ڕێز وگەورەیی وتەواوەتی دڵسۆزیی ئومەتەکەیەتی هەربۆیە بۆیانی حەڵاڵکرد وهیچ شتێکیش لەپاداشتی جیهادەکەیانی کەمنەکردەوە». کۆتایی.

ئەوەی بڕوانێتە سریەکانی پەیامبەر ﷺ وغەزوەکانی پێش جەنگی بەدر سەرسام دەبێت بەوەی سەرجەم سەرایا وغەزوەکانی پێش بەدر بەهۆی بەدەستهێنانی ووشترەکانی قورەیشیەکاندا بووە، غەنیمەت لەموڵکی کافرەکان شەریفترین دەستکەوتی بێ هاوتایە، وپاکترینیانە، وەهەروەها الله کردوویەتی بەسەرچاوەی قووتی پەیامبەرەکەمان وئالوبەتەکەی هەروەک دەفەرمووێت ﷺ: «لەنێودەستی[لەنزیکی] ڕۆژی قیامەت نێردراوم بەشمشێر هەتا الله بەتەنها ئەپەرسترێ بەبێ هاوبەش ورزقی من خراوەتە ژێر سێبەری ڕمەکەمەوە وزیللەت وبچووکی خراوەتە سەر هەرکەسێ سەرپێچی فەرمانەکانم بکات»، ئیمام ئەحمەد گێڕاویەتیەوە و بوخاری ئاماژەی بۆ کردوە.

الله صەدەقە وزەکاتی حەڕام کردووە بۆسەر پەیامبەر ﷺ لەبەرئەوەی خۆراکی لاوازەکان

